# بەڵگەکانی واجبیەتی

# عەبا و نیقاب

# لە قورئان و سونەتدا

ئامادەکردنی :

خادمة القرأن والسنة



1442هـ 2021 م

ناوی نامیلکە :

# بەلگەکانی واجبیەتی عەبا و نیقاب(پەچە)لە قورئان و سونەتدا

ئامادەکردنی :

خادمة القرأن والسنة

ساڵی :

١٤٤٢هجری - ٢٠٢١میلادی

ژمارەی لاپەرە : 20

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أَنفسنا ومن سيئات أَعمالنا من يهده الله ِ فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأَشهد أَن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأَن محمدا عبده ورسوله .
أما بعد: فإن أصدق الحديث كتاب االله وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

## پێشەکی :

پێشەکیەکە دەست پێ دەکەم - بەچەن دێرێک لەسەر نامیلکەکە م بەڕێزان ئە م نامیلکەیەی بەردەستان – باسی بەلگەکانی واجبیەتی عەبا و نیقاب دەکات لە قورئان و سونەتدا ، وە لێکدانەوەی هەر چوار مەزهەبەکە لەسەر بەلگەکان ،  وڵامێکە بۆ ئەو کەسانەی زانیاریان نیە و دەلێن بیدعەیە یاخود ئینکاری دەکەن لەسەر واجبیەتی عەبا و نیقاب .

## سەرەتا بابزانین نیقاب چیە

نیقاب: بریتیە لەوەی کە ئافرەت خۆی پێ دادەپۆشێت، وەکو ئەوەی دەڵێن: ئەو ئافرەتە خۆی داپۆشی بەوەی رووخساری خۆی شاردوەتەوە.

## جیاوازی نێوان خمار و حجاب و نیقاب :

خمار : بۆ داپۆشینی سەر بەکاردێت .

حجاب : بۆ داپۆشینی هەموو لاشەی ئافرەت بەکاردێت .

نیقاب : بۆ داپۆشینی ڕوخسار بەکاردێت .

# بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆزدا :

## بەڵگەی یەکەم :

جصاص دەفەرموێت لەم ئایەتەدا:

الله تعالیٰ دەفەرمووێت :

(يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) (سورەتی الأحزاب : ئایەتی ٥٩).

واتە: ئەی پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم- بڵێ بە هاوسەرانت و بە کچانت و بە ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان و جوانیانی پێ داپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێن پاك)ی تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن وە خوا لێخۆش بووی میهرەبانە.

* (وقد فسر بعض الصحابة والتابعين ادناء الجلباب بستر الوجه؛ وهذا قول ابن مسعود، وابن عباس، وعبيدة السلمانى، وقتادة ، وحسن البصرى، وسعيدبن جبير، وابراهيم النخعي، والعطاء الخراساني، وغيرهم).

واتا : هەندێک لە هاوەڵان و شوێن کەوتووان ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، تەفسیری (ادناء الجلباب)دەکەن بە داپۆشيني (دەم و چاو) وە ئەوەش قسەی ( ابن مسعود، وابن عباس، وعبيدة السلمانى، وقتادة ، وحسن البصرى، سعيدبن جبير، وابراهيم النخعي، والعطاء الخراساني،و جگە لەوانیشە).

* وە محمدی کوری سیرین دەفەرمووێت: پرسیارم کرد لە عبیده السلماني دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە ( يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِن)ئەویش فەرمووی (مەبەستی پێی داپۆشینی دەمووچاوە..واتە نیقاب.)بڕوانە کتێبی (تفسیری ابن کثیر3/283).

دوای دابەزینی هەموو ئایەتەکانی حیجاب الله تعالیٰ ئەمری کرد بە

داپۆشینی هەموو لاشە و روخساریش-نیقاب- هەر وەك پێشەوا ئیبن عباس فەرموویەتی ڕەزای خوای لێ بێت.

* له ( علي بن أبي طلحة )هوە هاتووە کە پێشەوا ئیبن عباس (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) فەرموویەتی (أمر الله نساء المؤمنين إذا خرجن من بيوتهن في حاجة أن يغطين وجوههن من فوق رؤوسهن بالجلابيب، و يبدين عيناً واحدة).
واتە: (الله تعالی فەرمانی کردووە بە ئافرەتی ئیمانداران کاتێک دەردەچن لە ماڵ بۆ پێویستیەک دەبێت رووخساریان داپپۆشن بە جیلبابەکانیان و- نیقاب- تەنها یەک چاویان دەربخەن).

#(بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا ئافرەتانی گەنج فەرمان پێکراون لەلایەن پەروەردگاریانەوە بە داپۆشینی دەموچاویان لەبەرامبەر بێ گانەدا، وە پیشاندانی پاکێتی لەکاتی چوونە دەرەوەیاندا بۆ ئەوەی کەسانی خراپ تەماعیان تێنەکەن و چاویان تێ نەبڕن).

## بەڵگەی دووەم :

الله تعالی دەفەرمووێت (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ) ( سورەتی  الأحزاب : ئایەتی ٥٣ ).

واتە: ئەگەر داوای شتێکتان کرد لە ژنەکانی پێغەمبەر کرد ﷺ لە پشتی پەردە داوایان لێبکەن ئەم شتە پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوان .

با لێرەدا وردبینەوە و سەرنج بدەینە ئەم ئایەتە پیرۆزە ، جا ئەگەر الله تعالی ئەمری بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بکاکە خۆیان داپپۆشن لە کاتی قسەکردن و پێویستیەک لەگەڵ ئەو هاوەڵە بەرێزانە دا ئەوا ئێمە پێویسترە کە خۆمان داپپۆشین بەرامبەر بە پیاوان لەم سەردەمەدا چونکە ئەوان لە ئێمە پاکتر و لە خواترستر بوونە ، جا ئێمە ناگەین بە رووبعی ئەوانیش بۆیە داپۆشینی دەم و چاو دەست بۆ ئێمە ئەولاتر و گرینگتریشە ، واتا ئەم پێچەیە دەبێتە پەردەیەک لە نێوان ئێمە و پیاوانی بێگانەدا .

## بەڵگەی سێیەم:

الله سبحانە و تعالی دەفەرمووێت ((وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ)) [سورەتی النور : ئایەتی 31]

واتە : وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن و بپارێزن (لە سەیر کردنی نامەحرەم) وە عەورەتیان بپارێزن (لە داوێن پیسی) وە جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی بە دەرەوەیە و دیارە لە جوانی (وەك دەم و چاویان و دەستیان) وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بە سینگ و بەرۆکیاندا وە جوانی خۆیان دەرنەخەن (زیاد لەوەی دەردەکەوێت) بۆ مێردەکانیان نەبێت یا باوکیان یا باوکی مێردەکانیان یا کوڕەکانیان یا کوڕی مێردەکانیان یا براکانیان یا کوڕی براکانیان یا کوڕی خوشکەکانیان یا ئافرەتانی (ئیماندار) یا کەنیزەکە کانیان یا ئەو شوێن کەوتەو پیاوانەی کە بێ نیازن لە ئافرەت (وەك خزمەت کارو پیرو نەخۆش کە ئارەزووی ژن و مێردایەتیان نی یە) یا ئەو منداڵە کوڕانەی کە ئاگایان لە لەش (عەورەت) ی ئافرەتان نەبێت (باڵغ نەبووبن) (ئافرەتان لەکاتی ڕۆشتن دا) قاچیان نەدەن بە زەوی دا (تا دەنگی خرخاڵ و پاوانەکانیان بێت و) بزانرێت بەو جوانی یەی پێیان کە شاردویانەتەوە هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیمان دارەکان تا ڕزگار و سەرکەوتوو بن.

ڕوون و ئاشکرایە کە جوانی ئافرەت دەم و چاویەتی بزانە ورد بەرەوە کە کوڕێک دەچێتە داوای کچێک یەکەم جار بەر لە هەموو شتێک سەیری دەم و چاوی دەکات.  ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی کە دەم و چاوی ئافرەت جێگای سەرنج راکێشیە بۆ پیاوان وە بەدەرخستنی دەبێتە هۆی فیتنە و شەهەوات .

شێخی بەیزاویش دەڵێ : قسەی راست ئەوەیە ، مۆڵەت دان بۆ دەرکەوتنی دەم و چاو و دەستی ئافرەت تەنها بۆ کاتی ئەنجامدانی نوێژەکانە ، نەک دەرەوەی نوێژەکان ، چونکە هەموو لاشە و جەستەی ئافرەتان عەورەتە ، رەوانیە دەرخستنی و دەرکەوتنی و تەماشاکردنی إلا بۆ مێردەکەی نەبێت ، وەتەنها بۆ کاتی ناچاری وەک سەیرکردنی پزیشکی پیاو کاتێک کە پزیشکی ئافرەت نەبێت ، یان کاتێک ئافرەت دەم و چاوی بەدەرەوە دەکات لە کاتی شایەتی دان.

## بەڵگەی چوارەم :

الله تعالى دەفەرمووێت ((وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ)) [سورەتی النور : ئایەتی 60]

واتە :  وە ئافرەتانی لە ئیش و کار کەوتن لەبەر پیری و نەمانی ئارەزووەکانیان و توانای شوکردنیان نیە ، هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە کە هەندێ جل و بەرگی سەرەوەیان دابنێن و نەیپۆشن وەک عەبا و کەواو سەلتە ئەگەر بەبەردەم پیاوانیشدا بێن و برۆن بەڵام نابێ زینەت و جوانی خۆیان نیشان بدەن خۆ ئەگەر خۆیان دابپۆشن وەکو ئافرەتانی گەنج ئاوا چاکترە بۆیان ، وە خوا بیسەری زانایە.

ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە ئەم ئایەتە پیرۆزە ، کە ئافرەتی پیر و بەتەمەن و لەکارکەوتوو کە دەفەرمووێ
گوناهی لەسەر نیە ئەگەر عەبا نەپۆشێت بەڵام لە کۆتای ئایەتەکەدا دەفەرمووێ [وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ] کەچی ئەوانە چەند پیرن و بەتەمەن و لە شەهەوات وئارەزوو کەوتوون ، بەڵام هێشتا الله تعالی تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خۆیان داپۆشن وەک ئافرەتێکی گەنج و زینەتیان بەدەرنەخەن ئەوە باشترە بۆیان.

وە زینەتی ئافرەتیش زیاتر دەم و چاوە بۆیە ئافرەت هەر واجبە لەسەری ئەم زینەتە سەتر بکات.

## بەڵگەکان لە سونەتدا :

### بەڵگەی پێنجەم:

ئیمامی بخاری و مسلیم لە (کتاب التفسير ) لە باب (صدر الباب السنن ) بەریوایەتی دایکمان عائیشە (ڕەزای الله تعالی لێ بێت ) ئایەتی حیجاب لە سالی (٥)پێنجەمی هیجری هاتە خوارەوە وە تەفسیری عبدالله ی کوری عومەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (لا تتنقب المرأة المحرمة ، ولا تلبس القفازين )(صحيح المسلم رقم ١٥/ ٣ / ١٨٣٦ )
واتە: نابێت ئافرەت لەکاتی ئیحرام دەم و چاوی داپۆشێ و دەستەوانە لە دەست بکات.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتانی زەمانی پێغەمبەر خوا ﷺ پێچە و دەستەوانەیان لەبەر کردووە و خۆیان ستر کردووە لەبەرامبەر پیاواندا .

## بەڵگەی شەشەم :

عن صفية بنت شيبة أن عائشة رضي الله عنها كانت تقول : لما نزلت هذه الآية ( وليضربن بخمرهن على جيوبهن ) أخذن أُزُرَهن (نوع من الثياب) فشققنها من قبل الحواشي فاختمرن بها. * البخاري، كتاب التفسير، رقم:٤٧٥٩* ،رواه البخاري ( 4481 ) ، وأبو داود ( 4102 ).
واتە:لە صفیەی کچی شیبەوە هاتووە کە عائیشە دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) فەرموویەتی:(ئەوکاتەی کە ئەم ئایەتە دابەزی " وليَضرِبنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلى جُيُوبِهِنَّ" لە دامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێدەکردەوە و ڕوخسارمان پێ دادەپۆشی)

## بەڵگەی حەوتەم :

" عن عروة أن عائشة (رضي الله عنها ) تقول: يرحم الله نساء المهاجرات الأول لما أنزل الله { وليضربن بخمرهن على جيوبهن } شققن أكثف مروطهن (نوع من الثياب) فاختمرن بها " . أي غطين وجوههن * البخاري ....... رقم: ٤٧٥٨* ، رواه البخاري ( 4481 )، وأبو داود ( 4102 )
واتە:لە عروە وە هاتوە کە عائیشە(رضي الله عنها) فەرموویەتی:(

ڕەحمەتی خوا لەژنە کۆچبەرەکانی سەرەتا بێت کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی پارچەیان لەکراسەکانیان کردەوەو کردیانە بە نیقاب، واتە دەموو چاویان پێ داپۆشی).

حافظ بن حجر دەڵێ :(فاختمرن) (فتح البارى ٨/ ٤٩٠) واتا : دەپۆشینی ئافرەت بۆ دەم و چاوەکانیان . واتا الله تعالی رەحمی بە ئافرەتانی مهاجرین کرد کە ئەم ئایەتەی دابەزاند لە تۆقی سەریانەوە هەموو شوێنێکی لەشیان داپۆشن.

دایکمان عائیشە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت ) دەفەرمووێت (وكان - صفوان - يراني قبل الحجاب ، فاستيقظت باستر جاعه حين عرفني ، فخمرت وجهي عنه بجلبابي ) (متفق عليه ) لە ڕووداوی ئیفک (صفوان) لە کاتێک کە منی بینی بوو پێش ئەوەی ئایەتی حیجاب دابەزێت بۆیە منی ناسیەوە بەڵام کە خەبەرم بوویەوە جلبابەکەم بەسەر دەم و چاوم دایەوە و خۆم داپۆشت.

جا ئەگەر سەرنج بدەین کە ئەوان چەندە موتەقی بوینە دەم و چاو و دەستی خۆیان داپۆشیوە کەواتە بۆ ئێمە ئەولاترە کە لە زەمانی فیتنەدا دەژین و خۆمان دابپۆشین بە باشترین پۆشین.

خۆشی ئافرەتان و هەموو ئینسانێک لەوەدایە کە دەست بە دینی الله تعالی بگرێت و ئیطاعەی الله تعالی بکەیت.  بەڵام بەڵاو موسیبەت ئەوەیە کە خۆت دەربخەیت و سفور بیت و میکیاج و خۆت برازێنیتەوە بۆ کەسانی بێگانە لەم کاتانەدا زیاتر بەڵا و موسیبەت و فیتنە روودەدا.

شێخ عبدالعزیز دەفەرمووێ : زۆربەی ئەو بەڵا و موصیبەتانەی کە لە دەولەتان روودەدات بەهۆی میکیاج کردن و خۆ دەرخستنی زۆربەی ئافرەتان و خۆدانەپۆشینە لە ئاستی بێگانەدا وە دەرخستنی زینەتەکانیان (جوانیەکانیان ) کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی زوربوونی فەسادی لە ناو کۆمەلگا کە رێگە خۆشکردنە بۆ ئەنجامدانی تاوان و خراپەکاری و فەساد نانەوە.

## بەڵگەی هەشتەم :

ثبت في الصحيحين عن عائشة(رضي الله عنها) قالت : كان رسول الله(ﷺ)يصلي الفجر فيشهد معه نساء من المؤمنات متلفعات بمروطهن ثم يرجعن إلى بيوتهن ما يعرفهن أحدٌ من الغلس ) راوه البخاری

واتە:لە عائیشەوە(رضي الله عنها) فەرموویەتی:
پێغەمبەر (ﷺ )لە کاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی ئافرەتان دەچوون بۆ نوێژ کاتێ تەواو دەبوون وا خۆیان دادەپۆشت لەکاتی گەرانەوەیاندا کەس نەیان دەناسی .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەمەی ئافرەتانی پێشین بەشێوەیەک وا خۆیان داپۆشیوە کە دەم و چاویشیان بە دەرەوە نەبووە وە کەس نەیتوانیەوە بیان ناسێتەوە.

## بەڵگەی نۆیەم :

عن أسماء بنت أبي بكر -رضي الله عنهما- قالت كنا نغطي وجوهنا من الرجال وكنا نمشط قبل ذلك في الإحرام" [أخرجه الحاكم (1\454) وقال حديث صحيح على شرط الشيخي

واتە: لە ئەسمای کچی ئەبوبکر-(ڕەزای الله لە هەردوکیان بێت) فەرموویەتی: (ئێمە دەم و چاومان دا ئەپۆشی لە بەرامبەر پیاوان، وە لە ئیحارمیشدا قژمان شانە ئەکرد).ئەم فەرمایشتەی ئەسماء بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە کە ئافرەتە ئیمانداراەکانی ئەوکاتە نیقابیان پۆشیوە واتە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ. وە هە روە ها قە ولی عائیشە ش هە یە کە نیقابیان کردوە دە موچاویان دا ئە پۆشی لە پیاوان.

## بەڵگەی دەیەم  :

(عن عائشة قالت كان الركبان يمرون بنا و نحن مع رسول الله ﷺ محرمات فإذا  حاذوا بنا سدلت إحدانا جلبابها من رأسها على وجهها فإذا جاوزونا كشفناه ) [ الكتب ، سنن أبي داود ، كتاب المناسک ، باب في المحرمة تغطي وجهها ، رقم : ١٨٣٣ ]

واتە : دایکمان عائیشە (رەزا و رەحمەتی الله تعالی لێ بێت ) دەفەرمووێ ئێمە کاتێک لە ئیحرامدا بووین ئەگەر سوارچاکان بەتەنیشت ئێمەدا تێپەری کردبا دەم و چاوی خۆمان دادەپۆشت پێچەکەمان دەهێنا خوارەوە وە ئەگەر رۆشتبان هەلمان دەدایەوە.

## بەڵگەی یازدە :

(عن ام سلمة قالت : لما نزلت يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ خرج نساء الأنصار كأن على رءوسهن الغربان من الأكسية) (سنن أبي داود ، رقم ١٩٧ ٦، ، ٤١٠٤)

واتە : دایکی سەلەمە دەڵێت کاتێک ئایەتی (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) دابەزی ، ژنە ئەنساریەکان خێرا رۆیشتن و سەر ودەم و چاوی خۆیان داپۆشت ، پۆشاکەکانیان رەش هەڵدەگەرا ، وەک ئەوەی قەلە رەش لەسەریانەوە نیشتبێت.

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتانی سەلەف (پێشین ) ئەو جلبابەی کە خۆیانی پێ داپۆشیەوە لەسەریانەوە تا پێیەکانیان رەش بوو کە جلەکەیان دەشوبهێنێ بە قەلە رەش واتە جلی رەشیان لەبەرکردووە بۆ دەرەوە .

## بەڵگەی دوازدە :

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : ( الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ , وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ ؛ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ , وَإِنَّهَا لَا تَكُونُ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ : أَقْرَبَ مِنْهَا فى قعرِ بيتِها ) .[المعجم الكبير للطبراني-ج ١٠ - تابع عبدالله بن مسعود - عبدالله بن عباس - ،، ص ١٣٣ ،، رقم الحديث ١٠١١٥ ]
واته : له عبدالله ی کوری مه سعوده وه (ڕه زای خودای لێبێت) له پێغەمبەرەوە( صلى الله عليه و سلم ) ده فه رمووێت : ئافرەت عەورەتە ، کاتێك لە ماڵەوە دەرئەچێت ، شەیتان لەبەر چاوی پیاوانی نامەحرەم دەیرازێنێتەوە ، بەڕاستی چاکترین شت بۆ ئافرەت بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنێت مانەوەیەتی لەناو ماڵەکەی
پێغەمبەر (ﷺ )فەرموویەتی:(المرأة هي العورة) واته ئافرەت عەورەتە ئەمەش واتە هەموو گیانی عەورەتە، مەبەست لێرەدا هەموو ئەندامەکانی لەشی ئافرەت دەگرێتەوە دەم و چاو و دەستیش لە ضمنی ئەندامەکانی لەشی ئافرەتە .

## جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان ,سەبارەت بە نیقاب دوو وتە هەیە :

#یەکەم : هەندێک زانا دەلێن واجبە ئافرەت روخسار و دەستی خۆی داپۆشێت ، کە ئەمە وتەی حنابلە و شافعییە .

#دووەم : هەندێک زانای تر دەڵێن سونەتە ئافرەت روخسار و دەستی خۆی داپۆشێت ، کە ئەمە وتەی ابو حنیفە و مالکە .

#بەلام زانایانی حنفی و مالکی لە کۆنەوە فەتوایان داوە کە واجبە لە کاتی فیتنە ئافرەت روخساری خۆی داپۆشێت ، مەبەست لە فیتنە ئەوەیە ئافرەتێک زۆر جوان بێت یان کاتێک بێت خەلک زۆر خراپ ببێت فیتنە زۆر ببێت .

✔واجبە لەسەر ئافرەت خۆی داپۆشێ لەوانەی کە مەحرەمی نین ، ... کەواتە زانرا کە ڕوخسار لەهەمووان لە پێشترە دایبپۆشی ، بەلگە هاتوون لە قورئان و سونەت و وتەی هاوەلان و زانایانی ئیسلام کە واجبە ئافرەت هەموو لاشەی خۆی دابپۆشێت لەوانەی کە مەحرەمی نین . ))

▬فەرموودە هاتووە : " نەهی کراوە لە نیقاب کاتی ئیحرام " ئەمە بەلگەیە کە پێش ئیحرام نیقاب ماوە دەبێت ئافرەت نیقاب بێت . .....

## ▬رونکردنەوەیەکی پێویست:

✔ گومانی تێدا نییە باشتر وایە ئافرەت هەمووی لاشەی داپۆشێت هەتا ڕوخساریش بەتایبەتی کاتی فیتنە کە ئەوانەی دەلێن نیقاب سونەتیشە دەلێن کاتی فیتنە واجبە ، هەروەها شەڕی گەورەی ئافرەت لە روخسارە

ئەوەندەی پیاو سەرسامی ڕوخساریەتی ئەوەندە سەرسامی لاشەی نییە ، ڕاستە لاشەش کاریگەری هەیە بەلام کاریگەری ڕوخسار زۆر زیاترە .

✓ ئەوەی گرینگ بێت کەس ئینکاری ئەوەی نەکردووە کە نیقاب دینە ، بەلکو جیاوازی لەوەدایە ئایا سونەتە یان واجبە وە هەرچوار مەزهەبەکان لەسەر ئەوەن کە کاتی فیتنە واجبە ، چەند ئافرەت هەن نیقاب ناکەن لەبەر جوانی ڕوخساریان ؟! ئەگەر نیقاب سونەتیش بێت چەند ئافرەت پابەندن بەم سونەتە ؟! ئەگەر ئافرەتی موسلمان ئەم سونەتە جێ بەجێ نەکات کێ جێ بە جێ بکات ؟! ئەگەر ئافرەتی موسلمان سونەتی لا خۆشەویست نەبێت ئەی کێ سونەتی لا خۆشەویست بێت ؟! چەند ئافرەت دژایەتی نیقاب دەکەن بە توندڕەوی وەسف دەکەن ؟!

✓ ئێمە لە سەردەمێک داین خۆمان دوژمنی دینی خۆمانین ، بەلکو ئەوەی سەیر بێت کەسی پابەند بە دین دژایەتی نیقاب دەکات و پێی باشترە نیقاب نەبێت بەلکو تەنها حیجاب ، زۆر زۆر ترسناکە پێچەوانەی دینت لا باشتر بێت چونکە نیقاب دینە و زۆربەی زانایان دەلێن واجبە ، وە ئەگەر کاتی فیتنە بێت ئەوانەی دەلێن سونەتیشە دەلێن واجبە ، پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت دەفەرمووێت کەس هەیە چەندن پایز یان چەندین سالٚ لە دۆزەخ دەمێنێتەوە لەسەر یەک وشەی کەچی لای شتێکی ئاساییە ..

📎 موسلمان دەبێت گوێرایەلی فەرمانی خوا و پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت و رێز لە وتەی هاوڵان (رضي الله عنه) و زانایان بگرێت و ڕێز لە قورئان و سونەت بگرێت و دژایەتی دین نەکات ، چونکە دژایەتی سونەت کردن کوفرە پەنا بە خوا ، وە کردەوە باشەکانی مرۆڤ هەمووی پووچ دەکات ، بەلکو واجبە سونەتی خۆش بوێت نەک ڕقی لێ ببێتەوە و دژایەتی بکات .

بەفەزڵ و منەتی الله تعالی تەواو بووین لە ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیە  داواکارم لە الله تعالی لەکەم و کورتیەکانمان ببورێ وە ئەم کارەمان بەنیەتێکی پاک لێمان وەربگرێ وە پارێزراومان بکات لە ڕیا و ویستوی ناوبانگ .

وأخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين
وصلى الله على محمد و على آله وصحبه وسلم

# بەڵگەکانی واجبیەتی

## عەبا و نیقاب

## لە قورئان و سونەتدا

ئامادەکردنی :

خادمة القرأن والسنة



1442هـ 2021 م

